

زنجیرەی بلاوکراوەکانی گۆڤاری ناسۆی پەروەردەیی - ١٩ -

مامۆستا د کاودانێن نەخۆش دا

# وێنێن نەترسیێ



ژ وەشانێن ریکخراوا یونسکۆ - پەروەردا جیهانی

وەرگێڕان ژ ئنگلیزی

حەکیم عەبدوڵلا

چاپی یەکەم ———————— هەولێر

مامۆستا د کاودانێن نەخۆش دا

# وێنێن نەترسیێ

ژ وەشانێن رێکخراوا یونسکۆ - پەروەردا جیهانی

وەرگێران ژ ئنگلیزی

حەکیم عەبدوڵلا

چاپی یەکەم ــــــــــــــــــــــــــــ هەولێر

ناڤێ کتێبێ: وێنێن نەترسیێ
دانەر: ترێزا مورتاف
وەرگێڕان ژ ئنگلیزییێ: حەکیم عەبدوڵلا
دەرهێنانا هونەری: مەهدی تەیب
بەرگ: زاگرۆس
لە زنجیرەی بڵاوکراوەکانی گۆڤاری ئاسۆی پەروەردەیی، ژمارە (١٩)
چاپێ یەکەم، هەولێر ـ ٢٠٠٤
تیراژ: (١٠٠٠) دانە

# ناڤەروك

**بابەت** | **لاپەر**


Palestine
Autonomous
Territories
p. 16
France
p. 18
United States
p. 12
Mongolia
p. 6
Haiti
p. 22
Lao People's
Democratic
Republic
Rwanda
p. 4
Niger
p. 10
Brazil
p. 20
South Africa
p. 8

# پێشەکی یا وەرگێری

یا زانایە کو پەروەردە و فێرکرن شەنگستێ پێشکەفتنا هەر مللەتەکی یە. پویتە پێ کرن ب ڤی کەرتێ گەلەك گرنگ ئەرکەکێ نشتمانی یە ل سەر ملێ هەر کەسەکی د جڤاکی دا. ئەڤ پویتە پێکرنە گەلەك بوارا ڤەدگریت: ئاڤاکرنا قوتابخانا، نویژەنکرنا ئاڤاهییێت کەڤن، دابینکرنا کەل و پەلێت خاندنێ، مفا وەرگرتن ژ شورەشا تەکنولوجی د بوارێ کومپیوتەر و ئنتەرنیتێ و گەهاندنێ دا، پویتە پێ کرنەکا تایبەت ب سێنتەرێ پروسێسا پەروەردێ کو ئەوژی ماموستایە. ئەڤەژی د ئێتە کرن ب باشکرنا بارێ ژیانا وی و ڤەکرنا خولێت پەروەردەیی و فێرکرنێ یێت جودا جودا ل ناڤ و دەرڤەی وەلاتی داکو مفای ژ رێکێت نوی ببینیت ئەویت د ئێنە ب کارئینان د فێرکرنێ دا. ئەڤ نامیلکە بەحسێ سەربورا دەه ماموستا د کەت ل دەه پارچێت جودا جودا ل جیهانێ. دەمێ من خاندی، ئێکسەر من هزرا وەرگێرانا وێ کر بو زمانێ کوردی دا کو خاندەڤانێ مە ب شێوەکێ گشتی و ماموستایێ مە ب شێوەکێ تایبەتی هزرەك هەبیت ل دور چەند کەسەکا و سەربورا وان کا چەوا شیاینە بەردەوامییێ بدەنە کارێ خو و کاروانێ پروسێسا فێرکرنێ. کا تا چ رادده کارینە بەرسینگێ کاودانێت نەخوش و دژوار بگرن و نەهێلاینە زارو بێ بەهر بن ژ مافێ وان یێ رەوا کو فێربونە.

ئێش و ئازارێت مروڤایەتیێ ئێکن هەرچەند ژینگەهـ یا جودا بیت. ئەز باوەردکەم ماموستایێت مە د کاودانێت نەخوشتر و دژوارتر دا بورینە لێ ئەڤ

چەندە نەبویە ئەگەرێ هندێ کو دەستا داهێلن و دەرگەهێ قوتابخانا بێتە گرتن و زارو بمینن نەزان. ب پێچەوانەڤە، سەرباری بار و دوخێت سەخت، رۆژ بو رۆژێ وورێت ماموستا ب هێز تر بوینە...، هیڤیدارم کو شیابم ب ڤی کاری خزمەتەکێ پێشکێش کەم و مفا ژ ڤێ نامیلکێ بێتە وەرگرتن و ئێدی بو پێشڤە.


حەکیم عەبدوڵلا

دهوک- ئادارا ٢٠٠٤

hakimabdullah٦٩@yahoo.com

# پێشەکی

ئـەڤ نامیلکـە ل دور نەترسـیێ یـە. نەترسـی و چـەلەنگی و ئازاییـا وان ماموستا ئەوێت رۆژ ب رۆژ زارویا فێر دکەن د سەر هەژاریێ و قەیران و دژواریـێ را. ئەڤ نامیلکە رێزگرتنە بو وەفاداری و دلسوزی و داهێنانا وانە بەرامبەر ئەرکێ وان.

هەر ژ بەرازیلێ تا مونگولیا و ژێرییا ئەفریقیا تا وەلاتێت ئێکگرتی، دەربرینـا ڤان ماموستایا بو هەلویستێ وان د ژیانێ دا کو هەستا مروڤی د هەژینیت بو مە ئەڤە یە کـو: بەرامبـەری دژواریـێ دراوەسـتن ل قوتابخـانێ، کـارێ وان دگـەل وان قوتابییا نە ئەوێت ئارێشێت جوراو جورێت مەزن هەین: بێت لەشـی، دەرونـی، ب زەحمەت فێربون، ژ بەر گوتن د پولێت گەلەك مەزن دا د کاودانێـت بـێ بـاریێ دا بێی هەبونا کەل و پەلێت سەرەکی بێت فێرکرنێ. گەلـەکا دڤێـت د ڤـی کـاری دا بمینن و بەردەوام ماموستا بن، لێ موچێت وان بێت گەلەك کێم وەل وان کریە کـو دو سێ کارەکێت دی ژی بکەن دا بژین.

سەرژمێریاری دیار دکەن کو ئێك ژ سـێ ژ ٥٠ ملیـون ماموسـتایا ل جیهـانێ شیانێت پەروەردەیی نینن و ئێك ژ سێ ژ ماموستایێت دی خولێت فێرکرنـێ بێـت تـەواو وەرنەگرتینـە. هەرچـەندە شـیرەتێت رێکخـراوا یونسـکو ل سـالا ١٩٦٦ دەربارەی کاودانێت ماموستایا، سەعەتێت کـاری و موچـە و خولێـت فێرکرنـێ و دەلیڤێت شولی دیار دکەن، لێ کاودانێت ماموسـتایا ل ٣٠ سـالێت دویفـرا بێـت نەخوش بوین ل بارا پترا وەلاتا.

ئەرێ بوچی ئەڤێت رولەکێ ناڤەندی هـەی د پەیـدا کرنـا فێرکرنـێ دا بـو هەمیا د ئێنە پاش گوھ ڤە هاڤێتن د وەختەکی دا کـو جیهـان ب ملیـارا دولارا ل چەکی د مەزێخیت؟ ئەگەر بێـت و ئـەم پـێش ئێخسـتنا مروڤـی بکەینـە د دلێ ستراتیجیەتا ئابوری و کومەلایەتی دا،دڤێت پێش ئێخستنا کاودانێت کـاری بێـت

ماموستای بێنە دیارکرن. دڤێت هەمی ژێدەرێت مروڤی و دراڤی بێت پێدڤی بێخینە کاری ژ بو باشکرنا ژیانا وان کو د ئەنجام دا ژینا زارویێت مە دێ پێش کەڤیت. دڤێت ماموستا بێنە نیاسین و هزرا وان بێتە کرن د پروسێسا بریار دانانێ دا. تو نە شێی سیستەمەکی چاك کەیەڤە ئەگەر ئەو کەسێت بەرپرس ژ جێ بە جێ کرنا گوهورینا د ئامادە نە بن دەمێ بریار د ئێنە دان.

د ئاخفتنا خو دا بهەلکەفتنا روژا ماموستایێت جیهانێ، رێڤەبەرێ گشتی یێ یونسکو ( فێدێریکو مایور ) داخازێ ژ هەمی حکومەتا و وەزارەتا و شارەوانیا و دەستەیا دکەت کو " رولێ سەرەکی یێ ماموستایا د دانانا جیهانا سبەهی دا بێتە زانین و هاریکاریا پراکتیکی یا پێدڤی بو وان بێتە کرن ژ بو بجهئینانا ئەرکێ وان یێ گرنك."

ئێلی جوین
جێگرێ سکرتێرێ گشتی
یێ پەرەردا جیهانی

کولن ن . پاوەر
هاریکارێ رێڤەبەرێ گشتی ـ پەروردە
یونسکو

# پی ئویمبابازی

## رواندا

**"بانیّ تژی کونیّن فیشەکایە و دەمیّ باران دهیّت دڤیّت ئەز وانە گوتنیّ ب راوەستینم"**



" جینو سایدا سالا ١٩٩٤ صەدمەکا ب صەهم بوو ، بو هەمیا " ئو یمبابازی، ماموستا یا قوتابخانا ( کینیا ) ل رواندا، عەردیّ هزار گرا، ڤەدگیّریت و دبیّژیت"کومکرنا پارچا نە کارەکیّ ب ساناهی یە دبواریّ فیّرکردنیّ دا هەما تشتەکیّ مستەحیلە". ئەریّ تو چ هزر دکەی دەربارەی وان زاروکا ئەویّن چ پەیوەندی نەمای کو بەشداریێ ب شیّوەکیّ ئاشتیانە بکەن دگەل وان زاروکا ییّن دەیبابیّن وان ب درستی پشکداری د جینو سایدیّ دا کری و دهندە حالەتا دا خیّزانیّت وان کوشتین " ؟

٢ ملیون رواندی یا گیانیّ خو ژ دەست دا د جینوسایدیّ دا ژ وانا ٥٠ ژسەدیّ د بواریّ پەروەردیّ دا کاردکر. ژ کوییّ ١٢ ماموستاییّن ژن ل قوتابخانا ماموستا (پی)، ٧ ژیّ بیژنن کو زەلام و زاروکیّت وان هاتینە کوشتن ژ لاییّ چەکداریّت ( هوتو ) ڤە. ڤیّجا تو هزر دکەی کو ڤان بیژنا دیّ چ هەستەك هەبیت

بەرامبەر کاریّ وان، و وانیّت ژهەژی بیّـژن؟ ئـەو یـیّ د حالـەتیّ تَـەدمیّ دا ".
نزیکی ٨٠ ژ سەدیّ ژ قوتابییّن قوتابخانا (پی )یّ بونە ئیّتیم و هەست ب تەنیاییّ و بەرزەبونەکا مەزن دکەن.

ژبو هاریکاریا وان،ماموستا هەول ددەن کو قوتابیا بکەن گروب دا پیّکڤە یاریا بکەن و ژکارلیّکرنا قورتال بن. لیّ ب هزرا ماموستا( پی) ئەو دهەوجەی کەسیّن شارەزا نە دڤی کاری دا.

شەری نەبتنیّ گیانیّت مروڤا برن بەلکو قوتابخانەو نەخوشخانە ب سەر ئیّـك دا ئینان، بنگەهیّت تەندروستی کاڤل کرن. (پی) دبیّژیت" ئاڤاهییّت قوتابخانا ییّت د رەوشەکا خراب دا، قوتابی ل سەر پارچیّت داری درویـنە خاریّ و ب زەحمـەت روژیّ خریّ بشیّن گوهداریا دەرسیّ بکەن ، ژبەرکو بـو دویراتیـا چـەند میلـەکا ب پیّیـا دئیّنە قوتابخانیّ. چ فروشگە د قوتابخانیّ ڤە نینن ژبەر هندیّ گەلـەك ماموسـتا و قوتابی د میننە بیّ فراڤین. ئەڤە مەعنا ویّ ئەوە کو وانیّت ئیّڤاریـا ژخوڤەکرنـە و بدرستی نائیّنە گوتن و فیّربون.دەربارەی بارو دوخیّت ژینیّ ،ماموستا ل رواندا زور د هـەژارن، موچـیّت وان تیّـرا هەوجـەییّت ژیـانیّ ناکـەن و هـاتن و چـوون ژی گرفتارییەکا دی یە. (پی) دبیّژیت " دڤیّت ئەز دەمژمیّر چار ونیڤی سپیّدیّ ژ خەو رابم، داکـو دەمژمیّرحـەفت ونیڤـی سـپیّدیّ ل قوتابخـانیّ بم "خولیّـت فیّرکرنـیّ زەحمەتەکا سەرەکییە ل رواندا.

بیّ‌ی راهیّنانا ماموستاییّت دخزمەتیّ دا، شیانیّت وان لاواز دبن د وەختەکی دا کو ریّکیّت فیّرکرنیّ ییّت پیّش دکەڤن.( پی) دبیّـژیت "ماموسـتاییّن شـیانیّن وان لاواز دڤیّت خو زیرەك کەن دا بمینن". گرفتاریەکا دی مەیاهەی ئەو ژی کیّمیا کەل و پەلیّت فیّرکرنیّ یە و نامیلکا و پـەرتوکیّت وانـە گـوتنیّ هـەما نیـنن. ل پـولا شەشیّ من ئیّك پەرتوك یا هەی بو هەشت قوتابیا و پەرتوکەکا زمانیّ فەرەنسی و ئیّکا بیرکاریێ ".

ماموستا هزر دکەت کو دڤیّت هـەمی خـەلکیّ روانـدا پویتـەی ب پـەروەردیّ بکەن و بتایبەتی دەزگەهیّت گشی. مل بمل وەکی وی دراڤـیّ بـو بـەرگریێ دئیّتـە تەرخانکرن. هەروەسا ماموستا (پی ) داخازیّ ژ ئیّکەتییّن ماموستایا دکەت کـو

داخازا مافێت وان بکەن و کومەلێت دەیبابا گازندێت وان بەلاڤ بکەن. (پـی )
دبێژیت" ئەز سەد دەر سەد یا کەیف خوشم کو ئەز ماموستا مە. ئەڤ کارە ئـانکو
پەروەردە شەنگستیێ هەمی کارەکییە.هەمی سیاسەت مەدارییێت چوینە قوتابخانا و
هەمی زانا و هونەرمەند و تەکنیکار بێت دشیاین ئەڤا کارا بکەن ئەوێت وان کرین
و سوپاس بو وێ پەروەردا سەرەکی یا ئەو فێر بوین."

# تسیریندوزهین ئورتناسان
## مونگولیا

**" ئەزێ هزردکەم کو دەست ژ فێرکرنێ بەردەم "**

**" خوشە مروڤ ماموستا بیت،لێ من خێزانەکا هەی دڤێت بخودان کەم"**



هەر چەندە ئەڤەنە سروشتێ ویـــە،لێ ماموســـتایێ سەرەتایی ( ئورتناســان ) کـو ژیێ وی٢٤ ســالن و ل بـاژێرێ (ئولانباتــــار)ێ مونگــولی دژیت،هەردەم هزراخو د پارادا دکـەت. ئورتناسـان دبێـژیت" هەمی روژا ئەز وانێت خو بلەز دبێژم دا بچمە بازاری و هندە پارا لێکـدەم". ئـەڤ ماموستایە دبێژیتە موچێ خو یێ هەیڤانە " پیچا پارەی". ئورتناسان و ژنـا خـو کو ئەو ژی ماموستایە و کچا وان یا بچویك ل نك خزمێت خو دژیت. ئەو موچـێ خو بکرینا تشتا دمەزێخیت و پارێت کرییێ و کارەبێ دەیبابێـت ژنـا وی ددەن. لێ وی دڤێت یێ سەربەخو بیت. دبێژیت " ئەز نزانم ئەم دێ چەوا قەتینین هـەکو ئـەم دمینینە بتنێ، لێ دڤێت سالەکا دی من مالاخو هەبیت".

خەلکێ مونگولیا ب توندی باوەریێ ب وی پرنسیپی دئینن یێ زەلامی ددانیت سەرێ مالێ و دڤیا زەلام خێزانا خو بخودان کەت. دەربارەی ڤێ چەندێ ئورتناسـان دبێژیت" ماموستایێت سەرەتایی یێت زەلام کو خودان خێزان بن، وەکی سـتێرا ب روژێ دکێمن". رێز و قیمەتێ پیشا ماموستاییێ هندێ نزمە هەتا وی راددەی کـو

ئێکێ وەکی ئورتناسانی شەرم دکەت کو ل جهەکێ گشتی ئێك گازی کەتێ ماموستا. ژبەر هندێ دەمێ قوتابییێت خو دبەتە ژدەرڤە، شیرەتا ل وان دکەت:" گەلی زاروکا: دەمێ هوین سیاری پاصێ دبن نە هەوجەیە هوین گازی کەنە من بەگشا، بەگشا ( ماموستا)، هوین تێ گەهشتن ؟". پاص یا تژییە و چ کورسیکێت ڤالا نینن. ماموستا و قوتابی ژ پێرڤە د راوەستیای نە: ژنشکەکێ ڤە قوتابی گازی دکەن" بەگشا: بەگشا ئەڤە کورسیکەکا ڤالایە تو لێ روینە".

ئەڤ بارێ خراب، ب هزرا ئورتناسانی،ئەگەر ژێ ئەو ژمارا ماموستایانە ئەوێت لاواز و بێ شیان د قوتابخانادا کو نوکە ژمارا وان ژ ٢٠٠٠ پترە. لەورا مروڤێت گەنج سەحدکەنە فێرکرنێ کو شولەکێ ب زەحمەت و بێ فایدە یە.

سیستەمێ پەروەردێ ل مونگولیا یێ پێکولێ دکەت کو ژ سیستەمێ مەرکەزیەتێ بێتە گوهورین بو ئابورێ بازاری یێ ڤەکری و سەربەست. ئەڤ ماموستایە دبێژیت" ئەڤرو گەلەك زاروك دوانا من نەگەهشتن. دڤێت ئەو فێری دو ئەلیف بێ یان بن .... یا سلافی و یا مونگولی.

ئەو دترسیت گەلەك پرسیارا ژ زاروکا بکەت نەوەك ل دویماهیێ هەر دو ل بەروان بەرزە بن. پەرتوکێن مەنهەجی نە دجهێ خو دانە .. "بتنێ د گوتجاینە بو وان ئەوێت زیرەك و بێت دی دێ میننە برێڤە ". ئەو قوتابخانێت ل دەڤەرێت دویر گازندا دکەن ل دور گیروبونا وەرگرتنا پەرتوکا و کەل و پەلێت دی بێت خاندنێ. هەروەکی بڤێ چەندێ زاروك دئێنە سزا دان چونکی ل گوندا دژین. ل دویماهیێ و دئەنجامدا خەلکێ گوندا دڤێت قەستا بازێرا بکەن.لێ ژیانا بازێری ژی گرفتاری بێت خو هەنە" زاروکێت بازێرا چ ژ سەر و بەر و رێکێت ژیانا مونگولی نزانن و بساناهی دئێنە بەرزەکرن" باشترین تشت دڤیدەمی دا کو ماموستا ئورتناسان دشێت بکەت ئەوە کو تشتێ گرنگ بو خەلکی ڤەگوهێزیت. ل دور ڤێ چەندێ دبێژیت" ئەگەر تو فێری چ تشتێ دی نەبی، هەما چ نەبیت فێربە کو تو یێ باش بی.نە پێدڤییە ئەم هەمی زانا بین لێ دڤێت هزرا مە هەمیان بێتە کرن".

ب لاوازیا وەفاداریێ، ئورتناسان دان پێ نانێ پ شیانێت خو دکەت " ماموستایێت ژن دشێن هندە تشتا بکەن کو ماموستایێت زەلام نەشێن بکەن."

بڤێ ئاخفتنێ بیراوی و رویدانەکێ دئێت کو کـار لێ کـری" دەمــێ جـارەکێ مــن ژبیرکری بەحسێ ڤیستەڤالەکا هونەری یا زاروکا بو قوتابییێت خو بکەم ئەوان گوت ئەگەرماموستایا مە ژن با دامە بەتە وێرێ".

ژهینگێ وەرە ئورتناسانی یا داخاز کری کو سالەکا دی ماموستایەکا ژن پــولا وی وەرگریت.

# لورنا دیڤدز
## ئەفریقیا ژێری

**" زەحمەتە تو زاروکا فێری وەفاداریێ و راستگوییێ بکەی د دەمەکی دا کو دەیبابێت وان دز بن و د ترومبێلێت نوی ییێت دزی دا بگەرییێن.**



باژێرکێ ئەلیکساندرا یێ ب قەرەبالغ و خودان کەش و هەوایەکێ نەخاوێن و ب مەترسی یە،ئەڤ باژێرکە د کەڤیتە نیڤا زەنگین ترین دەڤەرێت خەلکێ سپی ل جوهانسبرگ. ئها ئەڤە ئەو جهە ئەوێ کو ( لورنا دیڤدز ) ێ هاریکاری کری د دانانا قوتابخانا ( والدورف )ا * سەرەتایی دا ل سال١٩٩٠ .

بەر بەلاڤیا رەگەزپەرستییێ و هەژارییێ و بێ کارییێ و رێژا بلندا نەخوێندەوارییێ کو ( ٧٠٪ ) یە، ئەڤە هەمی پشکدارییێ دکەن دخوشکرنا زەمینی دا ل ئەلیساندرا ژبوئێشاندنا زاروکی، دزینا ترومبێلا، قەچاغیا موخەددەراتا و چەکی. هەروەسا پەنابەرێت نە یاسایی ژی ژدەولەتێن ئەفریقی یێن دراوسیێ ل وێرێ د بارودوخەکێ بێ‌ی کارەب و ئاڤ و جوکێن پاقژ دا دژین.

ئەو کولێ و کوتانێن ل دورێن قوتابخانا لورنایێ ژێدەرێت گەلەك دەلیڤێن فێربونێ نە. لورنا دبێژیت " دەمێ من وانە دگوت ل دورناڤ و پەسنا بو قوتابیێنن ٩ سالی، وان د پەنجەرێ را ژنکەك دیت یا درێژکری ل بن سیبەرا دارەکێ، ژ

نشكەكیٚ ڤە ئیٚكی ژوان، كو نـاڤیٚ وی (تشیپیسـو ) بـو گـازی كـر" لورنـا وەرە سەحكە كەلەخیٚ هەییٚ مەزنیٚ رەش، مـن نـەزانی چـەوا دیٚ بەرسـڤیٚ دەم ژبـەر هندیٚ من ب نەرمی بـەردەوامی دا وانـا خـو و ل دویـف وی تشـتیٚ وان دیتـی. كەلەخ ناڤ بو ، رەش و مەزن پەسن بون. پشتی هینگیٚ قوتابیا چ جارا ناڤ و پەسن ژ بیر نەكرن. بازیٚركیٚ ئەلیكساندرا،بیٚ بەرنیاسە ب شـەریٚت چـەكداری دناڤبـەرا پالپشتیٚن بزاڤا ( ئنكاپا ) و ( كونگریٚ نیشتمانی بیٚ ئەفریقی ). زاروكیٚت قوتابی بیٚن سەرەتایی، هەتا پیٚنج زمانـا د ئـاخڤن — ئـەوژی ئەڤەنـە: شـوتو، تسـوانا، زولو،پیٚدی و هندەكیٚن دی - هەرچەندە ئەو نەشیٚن ب ڤان زمانا بنڤیسن. ژبەر ڤیٚ یەكیٚ ل قوتابخانا لورنا بیٚ كـو وانـە گـوتن ب ئنگلیزیـە، بـو زاروكـا تەحدیـەكا مەزنە" ل ڤی بازیٚركی گەلەك كیٚم نمونیٚن زاروكیٚن باش هەنە.بو نمونە دوانـەكیٚ دا بەحسیٚ ( مایكلیٚ قەشە دهاتە كرن دەمیٚ شەریٚ تنینی دكر. هندەك زاروك تـورە بون و كرنە قیٚری دڤیا مایكلی تنین كوشتبا. كورەكیٚ ترسنوك خو هاڤیٚتە دەریٚ و گوت " لیٚ هەكە مایكلی تنین كوشتبا، ئەوژی دا خراب بیت وەكی تنینی.هـەما دا ئەو بخو بیتەتنین."ئەڤ ئاخفتنە بو دان و ستاندنا پولیٚ بو دەمیٚ حەفتیـەكیٚ.لیٚ ل دویماهییٚ هەمی ل سەر هندیٚ ریٚك كەتن كـو ناچـیٚبیت تـو شـەریٚ دژواریـیٚ ب دژوارییٚ بكەی. بشتی هینگیٚ شەر د پـولیٚ دا كـیٚم بـون. قوتابخانـا لورنـاییٚ نـە حكومی یە، ژبەر هندیٚ ئعتیمادیٚ دەنە سەر بیٚشیٚن قوتابخانیٚن والدورف ل دەرڤە و پشكداریا خیٚزانا. ئەو دەیبابیٚت پیٚ چیٚنەبیت پاریٚت خانـدنا عـەیالیٚ خـو بـدەن، كاریٚن دی دكەن بو پولا و باغچیٚ قوتابخانیٚ. لورنـا شـروڤە دكـەت " ئـەو پـاریٚ هاتیە كوم كرن ل سەر ماموستا دئیٚتە دابەش كرن و گەلەك جـارا تیٚـرا هەوجـەیا ناكەت لیٚ ژبەر كو ئەلیكساندرا ناوچەكا ڤەدەرە و بیٚ بەهرە،لورنا هەول ددەت كو داخازا هاریكاریا دارایی یا حكومی بكەت لیٚ وەكی ئەو دبیٚژیت " یا ب سـاناهی یە پارە بیٚتە دابین كرن بو ئاڤاهیا و قوتابخانا و هەتا كەل و پەلیٚت ڤیٚركرنیٚ لیٚ نە بو موچیٚن ماموستا".

حەفت قوتابخانیٚن دی بیٚت ل ئەلیكسـاندرا هـەین لیٚ وەكـی لورنـا دبیٚـژیت " گەلەك دەیباب قوتابخانا مە دچیٚتیرنن بو هنارتنا زاروكیٚن خو چـونكی قوتابخانـا

مه خودان رەوشەنبییەکا جورا وجوره و ئەم وانا ب ئنگلیزی د بێژین. ئاخفتن ب ئنگلیزی گەلەکا پێدڤیه پشتی نەمانا رەگەزپەرستیێ ل ژێرییا ئەفریقیا ".

کەش و هەوایێ دژواریێ ل ناڤ کومەلگەهێ کارەکێ مەزن هەیە ل سەر زاروکا. هوسانێ لورنا ئاخفتنا خو ب دوماهی دئینیت " فێرکرن و نیشادانا قیەما و نەهێلانا حەزاوان بو دژواریێ تەحەدیەکا مەزنە. ماموستا پێدڤی پالدانێ یە دا شەرێ تنینێ گونەهباریێ بکەت ئەوا بەلاڤ ل هەر جهەکێ وەلاتی".

*مەرەما ڤان قوتابخانا ئەوە کو داهێنانێ و هزرکرنا سەربەست لنك زاروکا پێش بێخیت. یەکەم قوتابخانە ل سالا۱۹۱۹ هاتە ڤەکرن ژلایێ فەیلەسوفێ نەمسا وی( رولدولف شتاینەر)ی ڤە.

## حەمە عەلی دیالو
# نایجیر

**"زاروك سەحدکەنە من هەروەکی ئەز بابێ وان "**




پێتێلکول گوندەکێ ڤەدەر و دویرە ب درێژاتیا ٣٥ کیلو مەترا ژنزیکترین باژێر ب رەخ بورکینا فاسو ڤە ل سەر توخیبێ نایجیر کو ئێکە ژ هەژارترین دەولەتێن جیهانێ و ئێکە ژ پێنج دەولەتا کو کێمترین ژمارا بجویکا قەستا قوتابخانێ دکەن.

ل پێتێلکول هاتن و چون ب پێیایە یان ب کەرایە یان ب عەرەبانایە ل دەڤەرا بیابان و بەرو و دارا و دارێت درێژیت باوباد ل ساڤانا. دەمێ بابێ هارماتان دئێت ، خیزی دگەل خو دبەت بو دویراتیا سەدان کیلو مەترا ل بیابانێ و بەرێ روژێ دئێتە گرتن بو دەمێ چەند روژەکا. دەمێ ل سالا ١٩٧٢ حەمە عەلی دیالو هاتیە ڤەگوهاستن بو گوندێ پێتێلکول، چەند زاروکەك بتنێ هاتنە قوتابخانێ کو ئێك ژور بو. هینگێ حەمە عەلی بریار دا کو گوهورینەکێ بکەت.حەمە عەلی دبێژیت " قوتابخانە وەکی کاڤلا بو. لێ ئەز ژ کارێ گران نەترسام. ڤێجا من دەست پێکرکو تشتا رێك بێخم. ل پێشیێ ئەز چوم دگەل دەیبابێت زاروکا کوم بوم ل گەلەك گوندا. و پاشی من ژورەکا دی د قوتابخانێ دا ئاڤاکر ب پیشی و کایێ و ب هاریکاریا زارویا وگەنجا. حەمە عەلی بیرا خو دئینیت و دبێژیت " دەمێ گیانەوەر ل دورێت قوتابخانێ

دچەرن، ژورا پولێ ددنە بەر لەقا و هویر دکەن و دخون کو ب گیایێ هشك و بەلگا هاتیە دابوشین. داکو ڤان گیانەوەرا دویر بێخیت، دڤیا وی ژورا پولێ ب بەرمایێ گیانەوەرا هونی با یان ژی خەندەکەك ل دورا کولا با.

حەمە عەلی دبێژیت " خەلکێ ڤێرێ مفایێ پەروەردێ نزانن" حەمە عەلی، کو ئەو بخو مروڤەکێ خێلەکییە، بو چارەسەرکرنا گرفتارێت ئامادەبونا قوتابیا هندە (مخصصات )ا ددەت " هندەکا نەڤێت زارویێن خو فرێکەنە قوتابخانێ. ئەوان دڤێت کو بمینە ل بەر گیانەوەرا.لێ دسەر هندێ را ئەز دێ یێ بەردەوام بم دبەلاڤکرنا پەیڤێ دا و ئەز دبێژم ئەز دێ ب سەر کەڤم". پروگرامێ خارنا جیهانی WFP خارنێ ددەتە قوتابیا و دەیباب ژی زادێ هشك وەردگرن وەکو هاریکاریەك دا زاروکێن خو بێت کچ فرێ کەنە قوتابخانێ. بو نمونە وەکو دیالو دبێژیت "ئەو خێزانێن دو زاروکێت کچ هەبن، ٥٠ کیلویێن دانی وەردگرن و یێت سێ هەبن١٠٠ کیلو وا . ئەڤرو رێژا ئامادەبونا قوتابیا ل قوتابخانا (پێتێلکول )ێ ٥٣ ژ سەدێ یە کو بلندترە ب معەدەلێ٢٠ ژ سەدێ ل قوتابخانێن دی ل نایجی. نزیکی نیڤا قوتابیان کچن. کو گەلەك ژوان د تەمەنێ شویکرنێ دانە.

ژبەر کو گەلەك ژ ڤان قوتابیان ل هندەك جها دژین کو ناڤبەرا ٥ هەتا ٨ کیلو مەترا دویری قوتابخانێ نە، جهێت نڤستنێ بێت جودا بو کچ و کورا هاتینە رێك خستن.

حەمە عەلی کو ژیێ وی٤١ سالن، دو ژنێن هەین و بابێ٥ زراوکا یە، قوتابخانێ وەکی مالەکا مەزن و بەرفرەه برێڤە د بەت. حەمە عەلی دبێژیت" پێدڤیە ل سەرتە تو سەخبێری یا زارویا بکەی ب شەڤ و روژ، ئاگەهداری تەندروستی و خارنا وان بی ، هەتا جلکێت وان ژی، فێرکرنا وان و د سەر هەمیێ را ب خودان کرنا وان ".

خەما حەمە عەلی یا مەزن ڤان روژا نەخارنە بەلکو ئاڤە. ل دوور ڤێ چەندێ دبێژیت " مەشیان نینن کو بیرا بکولین دا ئاڤا پاقژ بدەینە قوتابیان". وئەگەر ئەڤ ئاڤە هەبا، دا باغچێ قوتابخانێ ژی چێکەین".

حەمە عەلی دبێژیت " ئەز حەزدکەم دگەل زاروکابم، گوهێ خو ب دەمــە وان ، پشکداریا وان بکەم ب وی تشتێ بو وان گرنگ". و ب کەنیڤـە دبێـژیت " ژبـەر هندێ ئەز گەلەك حەز ژ ڤی شولی دکەم ... ئەڤ شوله بێن ڤەدانه ".

# ئێلیزابێت گونزالیز
## وەلاتێن ئێککگرتی

**" ئەو تشتێ من دڤێت بکەم فێرکرنە،لێ بارا پتر ئەز وەختێ خو د پەیداکرناناشتییێ دا د بەم ".**



دنیڤا ناڤاهییێت سوتی دا و دویکێلا کارگەها ل (برونکس )، کو هەژارترین دەڤەرێت نیویورکە، و ئێکە ژ هەژارترین دەڤەر ل وەلاتێن ئێککگرتی. ئێلیزابێت گونزالیز، کو ژیێ وێ ٢٥ سالن ب کارێ فێرکرنا زاروکێت شەش سالی رادبیت ل قوتابخانا (کلارمونت کومیونتی).

ل ڤێرە هندەك تشتێن هەین کو دڤێت ئێلیزابێت یا لێ هشیاربیت کو نە دەڤەرەکا ئێمنە: چ جارا نەمیننە ل قوتابخانێ پشتی دەم ژمێر ٥ ئێڤاری دەمێ زێرەڤان دچیتە مال. ئێلیزابێت دبێژیت" گەلەك ژ هەڤالا نامیننە ل سەر جادا. هەما بتنێ ژ جهێ راوەستاندنا ترومبێلا بو قوتابخانێ و هەتا هندەك دەرگەهێت پولا قفل دکەن. ئێلیزابێت دبێژیت " ئەز بومە ماموستا داکو تشتەکی بزڤرینم، چنکی ئەز هەست دکەم کو گەلەك تشت بێت هاتینە دان بو من.ب راستی من دڤیا بچمە مەکسیکو کو وەلاتێ بابێ منە لێ ژبەر کو ئەز

دو ئەزمانا دزانم، هەبونا من لڤێرێ دێ ب مفا تر بیت کـو نزیکـی نیڤـا قوتابیـا خەلکێ ئەمریکا لاتینی نە و نیڤا دی ئەمریکیێت نەژاد ئەفریقی نە".

دەیباب و زارو ئێلیزابێتێ دبینن " وەك جورە پـرەك دگـەل ژێـدەرێت زمـانی. ژنەکێ داخازا شیرەتەکی ژمن کر کو زەلامێ وێ وێ دقوتیت". دیسا ئێلیـزا بێـت دبێژیت " ژبەر هەڤرکی و شەرێ ل ناف مالێ، ئێك ژ قوتابیێن من سـێ روژا خـو ڤەشارت و ژ قوتابخانێ دویرکەت".

بێ کاریەکا بەر بەلاڤ و دەیکێت بێ زەلام، سـاخلەتێن ڤـی کومەلگـەهی نـە. هەرچەندە ئێلیزابێت فێرکرنێ ل ڤێ ژینگەهێ دبینیت کارەکێ ب زەحمەت، لێ بـو وێ وەکو ئەو هزردکەت خەلاتەکێ مـەزنترە ژ قوتابخانـەکا تـەواو و هـەمی تشـت هەبن" ل ڤێرێ ئەز سەرەدەریێ دگەل گەلەك هەلویسـتێن جـودا جـودا دکـەم ". پەیدا کرنا ئاشتیێ پارچەکا سەرەکیە ژ کـارێ وێ. کـو وان نورمـا نیشـا زاروکـا ددەت ئەوێ مروڤ ل مال فێر دبیت. شەر و دژواری و عێجزیا ڤان زاروکێت شـەش سالی وێ مەندەهوش دکەن. ئێلیزابێت دبێـژیت" تشـتێ مـن دڤێـت ئـەز بکـەم فێرکرنە لێ ئەگەر زارویـەك پـولێ تێـك بـدەت، پێدڤیـە ل سـەرمن ئـەز وی ب راوەستینم و ئاشتیێ پەیداکەم. ئەز یا رژدم ل سەر هندێ کو ئەو رێزێ ل ئێك و دو بگرن. وانا ژخرا پتر قوتابی حـەژێ دکـەن، لێنانـە. روژێ جـارەکێ ئـەم خـارنێ چێدکەین و ئەم پشکداریێ دخارنا وی تشـتی دا دکـەین ئـەوێ مـە ئامـادەکری. هندەك ژ زاروکا عاجز دبن چنکی پارجا باش نەگەهشتیە وان. ژ بەر هنـدێ ئـەم دان و ستاندنێ دکەین کا دێ چەوا دور دورانێ کەین."

سەیرانەك بو ( ستێتن ایلاند ) کو رێکا نیف سەعەتێ ب ترومبێلێ یا دویر بو، بو بیرهاتنەك، بو قوتابیێن گەنج هەر چەندە ئەو ل نیویـورك دژیـن لێ ئـەو جـارا ئێکێ بو کو ئەو عەور مالا ببینن و جارا ئێکێ بـو ئـەو ل بەلـەمێ سـیار بـن. ئێلیزابێت دبێژیت" ئەڤە بو قوتابیا وەکی ئەو دبێـژن هـەروەکی تەلـەفزیون ب رح کەتی ."

دا کو ئێلیزابێت پتر شیان هەبن سـەرەدەریێ دگـەل قوتـابیێن هێـدی فێـردبن بکەت، وانێت زێـدە بێـت وەرگـرتین داکـو هشـیاریێ و زیرەکیـێ پەیـدا بکـەت.

دەربارەی ڤێ چەندێ دبێژیت " کورکەکێ بچویك ل پولا من ب ساناهی نەد ئاخفت، من دزا نی کو ئەو حەژ ئاڤاکرنا قالبا دکەت ئانکو قالبا دانتە ل سەر ئێك، ڤێجا من داخاز ژ قوتابیا کر کو یاریا ب قالبا بکەن ب شێوێ کوم کومە و بەحسێ وی تشتی بکەن ئەوێ ئەو دکەن. ئەو پەیڤێت وی زاروکی بو خو گرتین، باوەری ل نك وی پەیداکر و نوکە ئەو زاروك بەشداریێ دپولێ دا دکەت."

ئێلیزابێت پویتەی ب هندێ نا دەت کو بارێ کومەلایەتی یێ ڤی شولی یێ نزمە و بێ بهایە. دەربارەی ڤێ چەندێ دبێژیت " ل ڤی وەلاتی جهێ تە دئێتە زانین ل سەر بناغێ هندێ کا تو چەندێ وەردگری و کا چەند دگەهیتە تە. من موچەکێ کێم یێ هەی لێ دەمێ ئەز دچمە مال، ئەز هەست دکەم کو من دەستێ خو یێ ب ڤان زاروکا دا ئینایە خارێ ".

# ڤانفێنك پێندالیت
## كومارا لاو یا دیموكراتی یا مللی

**" ب تشتێ ئەز وەردگرم بو چاڤدێریا زەلامێ من و خودانكرنا زاروكا دچیت. ب ژبەرنا مینیت. "**



تیروشـــكێن روژا گــەرم بــانێ قوتابخانــا ســەرەتایی ل گونــدێ ( سالاخام ) دسوژیت ل كومــارا لاو یا دیموكراتی یا مللی، و گامێشێت لاواز خو د ئاڤا زەڤیـێن برنجـی دا ئەوێن نزیك دگەڤزینن دا كو گەرما لەشێ وان بێتە خارێ.

د نـــــاف قوتابخــــانێ دا، ( ڤانڤێنگ پێندالیت )ا ماموستا كو ژیێ وی ٥٢ سالن دارەكـێ د دەسـتی دا و ب جلكێت فەرمی ب دەنگەكێ بلند د گەل قوتابییێت خو ئەلف بێ یا دبێژیت.

ڤانڤێنگ دبێژیت" گەلەك ژ مێژە مـن دڤیـا دەرسـا بێـژم و مـن ئـەڤ كـارە هەلبژارت چنكی كارەكێ شەریفە و ئەزا پێ رازیمە. كـارەكێ وەسـایە كـو هـەمی كەسا نەڤێت و نەبێ هندی یە كو تو پارەی پێ كوم كەی. "

جهێ گوندێ (سالاخام) بێ دویری گوندێت دی بێـت ( لاو )ە چـنكی دكەڤیتـە سەر وێ رێ یا كو ناڤبەرا پایتەختی ( ڤیانتیان ) و پرا ( فرێندشـپ ) د گەهینتـە ئێك كو ئەڤە پرا ئێكانەیـە ژ ڤـی وەلاتـی بـو (تایلانـد) كـو د ( مێكـونگ ) را دچیت. جورێ ژیانێ د مینتە ل سەر وەرزێن چاندنێ. لێ بازرگانیێ و پیشەسـازیێ و كارێن دی ژی یا دەست پێ كری و بێت دیار بـوین. ب پێچـەوانەی زاروكێـت ٤

هزار گوندێت دی ئەوێت کو چ جارا پول نە دیتی و پێنڤیس د دەستێ خو نەگرتی، زاروکێت (سالاخام ) هەمی د چنە قوتابخانێ. ئەڤ گوندە بێ گومان یێ ل سەر رێ یا راست.

ڤانڤێنگ دبێژیت" دسەر نەخوشیارا ئەز چ جارا دەستا نا داهێلم". ئەو نەخوشییێت ئەڤ ماموستایە دبینیت، د کەسایەتی نە و هەروەسا د گرێداینە ب کاری ڤە. هەر چەندە کو دو جارا یا بویە بیژن و دەیکا شەش زاروکایە،لێ ئەڤ ماموستایە هەفتیێ ٣٣ دەمژمێرا وانا دبێژیت و ئەو پارێ کوم دکەت ب کوتەك تێرا هندێ دکەت کو هاریکاریا هەر دو کچێن خو بێت مەزن بکەت ومێرێ وێ یێ ب تەمامی سەقەت. پشتی دەوامێ و دبێن ڤەدانا دا، ئەڤ ماموستا یە زەرزەواتی ل ناڤ بازاری د فروشیت و ب شەڤ ژی تا درەنگ دمینتە هشیار دا کێکا چێکەت بو مێرێ خو کو فروشیارەکێ گەروکە دا بفروشیت. هەروەسا ئەڤ ماموستایە دبێژیت" چ پارە ب فروتنا کێکا ڤە نا ئێت... ئەز هەول ددەم کو چ روژا من بێن ڤەدان نەبیت، لێ ب راستی زەحمەتە".

بەلێ ڤانڤێنگ ژ پویتە پێ نەکرنا دەیبابا خەم سار دبیت. گەلەك دەیباب پویتەی نا دەنە پەروەردێ و ئەو تشتێ ئەم پێدڤی دا کو ب دەینە زاروکێت وان. هەتا گەلەك ژ وان خو پێنوسەکێ یان دەفتەرەکێ بو عەیالێ خو ناکرن، ژبەر هندێ ئەز نەچار دبم بو وان پەیداکەم."

ڤانڤێنگێ خولەکا ئێك سالی یا وەرگرتی کو ئەو ژی بەری ٣٥ سالاً بو. کو ئەڤەژی نەیا ئێکا نەیە هوسا، چونکی ٤٠ ژ سەدێ ژ ماموستایێن سەرەتایی ئەوێت ل ڤی وەلاتی د ئێنە دامەزراندن د بێ شیانن. ل سالاً ١٩٩٥ بەشداری د خولەکا دەهـ روژی دا کر ل دور نویکرنا پێ زانینا یا کو بنگەهێ خزمەتێن پەروەردەیی پێ رابوی، هینگێ وێ زانی کو چەند پەروەردەیا هاتیەگوهورین.

" فێرکرن ئەڤرو نەوەکی بەرێ یە. رێکێت نوی و ب مفا دئێنە ب کارئینان. هەروەسا رێکێت ب زەحمەت بو نیشادانێ ژی. دڤێت ب درستی تو خو ماندی کەی. ب راستی ئەز ڤان تەکنیکێت نوی بێت فێرکرنێ دبینم کو ب زەحمەتن و ئەز پێدڤی هاریکاریێ مە دا ل سەر وان زال بم."

# سەمیح مسعد
## دەڤەرێن فەلەستینی یێت ئوتونومی

**" ئەز هەست دکەم کو ئەز یێ دارا دچینم و یێ بەرێ ددەن "**



هـــەمی روژا، سەمیح مسعد، کو ژیێ وی ٤٩ سالن، ژ گونـــــدێ (جەلەمە) کـو د کەفتـــە بـــاکورێ بـــاژێرێ ( جـنین ) قەستا قوتابخاا سـەر ب ئاجانـا هـەوار هاتن و کارکرنا فەلستینی ڤە ( UNRWA) یا نەتەوێن ئێکگرتـی دکـەت و دزڤریتەڤە. و ب شێوەکێ دامـای پـێ کـولێ دکـەت و هـزرا بەرسـڤا دکـەت بـو پرسیارێن قوتابییێت خو کو بەردەوام ڤان جورە پرسـیارا دکـەن کـا ئـەو بوچـی ل خیڤەتگەهێن پەنابەرا دژین و کا ژیان یـا چـەوا بـو ل گونـدو باژێرێـت وان بـەری سالا١٩٤٨ ێ.

ل سالا ١٩٩٥ کارگێریا فەلەستینی کەرتەکێ پـەروەردێ یـێ کاڤـل وەرگـرت. مسعد دبێژیت " هندەك ئاڤاهی بدرستی د هـەرفتی بـون و هنـدەکێت دی ل بـەر هەرفتنێ بون. چونا قوتابخانێ ب تا یبەتی ل گوندا مەترسیەکا مەزنە. "

ل حیڤەتگەها (جنین) ل کەرتێ روژئاڤا کو ١٢ هزار پەنا بەرێت فەلەستینی لێ دژین، بێ هیڤی بون یا بەلاڤە ژبەر سـستی و لاوازیا کریارا ئاشتیێ. ئەو هیڤییێت

پەنا بەرا هەین بو خوشکرنا کاودانێت وان. خانییێت خیڤەتگەهێ دیمەنێ بـاژێرەکێ کولکایە. ل ڤێ دویماهییێ ئاکنجییێت خیڤەتگەهێ توشی نەخوشیەکا ٣٠ روژی بون دەمێ ئاڤا پیس ژ بوریا چویە ناف سستەمێ کەڤنێ سولینێت ئاڤا ڤەخارنێ.

هزار و سەد قوتابی دچنە قوتابخانێن ( UNRWA ) یێـت سـەرەتایی. ئەڤـە هەمی پشکدارییێ د بیست حەنەفیا و جهێت دەست ئاڤێ دا دکەن. مسعد دبێژیت " ژبەر ژمارا زێدەیا قوتابیا، هەر پولەکێ ٤٥ تا ٥٠ قوتابی یێـت تێـدا. کـەل و پەلێت کەڤن.. نەبونا جهێت یاری کرنێ و خو مژیل کرنێ تشتەکێ بەلاڤ و دیـارە. مسعد پێڤە دچیت و دبێژیت" ژبەر شەرو و هەڤرکییێ، یا وە ل قوتـابی یـا هـاتی کو حەژ یارییێت توند و تیژ بکەن. وێنێ شورەشا چەکداری یا بو وان بویـە نمونـە. پیچ پیچە ئەز یێ شیایم کو دەست ب سەر ڤـان گرفتاریـا دا بگـرم. ئـەو ژی ب بەشدارکرنا قوتابیا د یارییێت رێك خسـتی دا ... دان و سـتاندن ب هـەڤالینی و دلوڤانی و تەرکیزکرن ل سەر فێرکرنا مەنهەجی، دا کـو رێکـا هزرکرنـا وان بێتـە گوهوین."

بێ کاری وە دکەت کو پاشەروژ نەیا دیار بیت بو قوتابییێـت مسـعدی. گەلـەك ژوان ل ڤێ دویمـاهییێ قوتابخانـەیا هـێلای دژیـێ ١٠ یـان ١١ سـالی دا. مسـعد دبێژیت " قوتابی بەردەوام پرسیار دکەن ئەرێ مفـاییێ وێ پـەروەردێ و فێرکرنـێ چیە ئەوا نەشێت خو کارەکی بو دەرچوییێت زانکوییێ ژی پەیداکەت. من یێ گوهـ ل ڤان دان و ستاندنییێت گەرم بـوی دنـاف قوتابیـا دا کـو ڤـی و یێنـێ نیگـەتف دەردبرن."

لێ مسعد شانازییێ ب وان دبەت ئەوێن شیاین کو خاندنا خو تەواو بکەن " ئەو هەستێ کو ئەز هاری ئاڤاکرنا کومەلگەها خو دکەم و ئـەو رێـز و تەقـدیرا ل مـن دئێتە گرتن ژ لایێ وان قوتابیا ڤە ئەوێن ژ زانکویا دەرچوین و کەتینە کارێ ژیانێ بو من بەسە."

پێکڤە گرێدانا سکێلێ موچێت فەلەستینی یا و بـارێ ژیانـا ئسـرائیلی یـا ب زەحمەتە. مسعد هزر دکەت کو دڤێت وەك هەڤیەك هـەبیت د دامەزرانـدنێ دا د ناڤبەرا فەلەسـتینی یـا و ئسـرائیلی یـا دا د موچـادا هەروەسـا مسـعددبێژیت"

هەروەسا ئەز حەز دکەم کو ببینم کومپیوتەر ب شێوەکێ بەرفرەهـ بێ د ئێتـە ب کار ئینان دا رێکێت نوی ل بەر ماموستا و قوتابیا ڤەبن و بودجەکا تەرخانکری دا کو کتێبخانە و تاقیگەهـ بێنە دامەزراندن."

# چانتال کولین
## فەرەنسا

**" ئەز هەست دکەم کو ئەز ئەو کەسم ئەوێ شیێری ب خودان دکەت دەمێ دچیتە قەفەسێ ڤە "**



ل قوتابخانا ( گوستاڤ ئیفیێل )١ پیشەیی ل دورێت پاریس، ئەو جهێ کو جانتال لێ ماموستا، نە تشتەکێ سەیرە ئەگەر قوتابی هەول دەن ئاگری بەردەنە قوتابخانێ. هندەك ژ ڤان قوتابیا گرفتارییێت یاسایی هەنە. ل ڤێ دویماهییێ ئێك ژ قوربانییێت یاریا تەنسێ هاتە قوتابخانێ و کێرەك دچانتا وی دا بو. هەر چەندە ئەڤ رویدانە د کێمن، لێ هەبونا تەخسیری یا دەیبابا و بێ کاریێ و گەلەك جوریا کومەلگەهی کو ٨٠ ژ سەدێ ژ قوتابیان د بنەرەت دا مشەختن، ئەڤە هەمی رامانا هندێ ددەت کو توند و تیژی نەیا دویرە ژ ڤێرە.

" ماف بێی بەر پرسیاری " هوسانێ چانتال هەلویستێ گەلەك قوتابیا ب کورتی دەردبریت. " بێ کاریا جیلێ دوێ، بێت فێری ژیانەکێ کرین و شیرەتێت وەرگرتن ژ کارکەرێت جڤاکی ل دور پارە وەرگرتنێ. ئەڤە دبیتە ئەگەرێ سەر گێژیێ. چانتال دبێژیت " قوتابیەکی بو دەمێ وەرزەکی هەمییێ دەوام هێلا و هێشتا وی دڤێت دەرباز ببیتە پولەکا دی" چانتال ددەتە خو یاکرن کە بابێ وی

قوتابی ڤێ چەندێ ب مافەکێ وی قوتابی د زانیت. بتنێ ١٠ ژ سەدێ ژ دەیبابا سەرەدانا قوتابخانێ دکەن. چانتال هزر دکەت کو گەلەك ژوانا دەست ژ بەرپرسیارییێت خو بەردانینە. چانتال شروڤە دکەت " فێرکرنا مە، ئەم بو ڤا جورە هەلویستا ئامادە نەکرینە" چانتال حەز دکەت کو هاریکاری یا وێ بێتەکرن ژ لایێ کەسێت بسپور ڤە دا کو سەرەدەرییێ دگەل هەرزەکارێت دەست نەخوش بکەت. ل دور ڤێ چەندێ چانتال دبێژیت " هندەك ژ قوتابیا نەهاتینە فێرکرن کا دێ چەوا دەست و دارییێ کەن. ژ پولێ دەردکەڤن بێی پرسیار کرن، دئێنە ژور بێی دەرگەهـ قوتان، د دەمێ وانە گوتنێ دا، د پولێ دا د ئێن و دچن. ئەڤ بێ تورەیی یە کاردکەتە سەر وورێت پولێ و ماموستا ژی. هەتا پتر ژ ماموستایەکی توشی ( انهیار عصبی ) بوینە. ئەڤ گرفتاریا قوتابیا و رێز لێ نەگرتن ب هزرا چانتالێ ژ داشکەستنێن بەردەوام دئێت. " ئەز هەول د دەم و ئەز تێ د گەهم کا فێربون چەوا روی ددەت. و کا چ تشتێ خەلەتە یان نە دروستە د دەمێ فێربونێ دا. ئەز باوەریا وان دئینم کو وان شیانێت فێربونێ یێت هەین" بو دەست نیشان کرنێ، ئەو داخازێ ژ قوتابیا دکەت کو هەمی تشتێت د وێنەکی دا ب تامی ژبەر کەن و هەتا بجویکترین پارچە. پاشی دەمێ قوتابی ب ژ بەر کرن بەحسێ وێنەی دکەن، چانتال پرسیارا وان دکەت کا چەوا شیان " قوتابی دبێژن " دەمێ ئەز د پاسێ دا من هزرا خو تێدا دکر. یان چ دەمێ ئەز د بەر دەرگەهێ تەرا دبوریم بیرا من دهات یان ژی من هزرا خو د تشتەکێ هویردا دکر و پاشی وێنەی هەمیێ" ئەڤ نیشادانە دبیت گەلەك جورا وەربگریت. چانتال قوتابیا پشت راست دکەت کو ئەو دشێن ڤێ تەکنیکێ ل سەر دەقەکێ نڤێسای ژی بکار بینن. بو نمونە ئەو پەرتوکا وێ ل مال ب کومپیوتەرێ خو ئامادە کری. مەزنترین خوشی بو وێ ئەوە دەمێ وێ گوهـ ل ڤان پەیڤان دبیت " ئەز نوکە تێ گەهشتم."

ئەڤ رێکا دەنگ و رەنگ رولەکێ سەرەکی دبینیت د رێکێت فێرکرنێ دا ئەوێن چانتال ب کار دئینیت. چانتال دبێژیت" ئەز گەلەك رێکێت گەهاندنێ ب چاڤا ب کار دئینم. چانتال ب خوشی ڤە بەحسێ کورەکی دکەت دەمێ یێ جەمانەدی ل هنداف وێ، کو داخاز ژێ کری کو ببیتە زێرەڤانێ وێ یێ کەسایەتی. ب کەنیڤە

دبێژیت " من چ ئارێشه نینن.. ل پێشیێ من هەست کر وەکی وی یێ شێری فێردکەت دەمێ دچیته د قەفەسێ دا. وەکی هندێ بو کو یان دڤێت تو وی بخوی یان تو دێ ئێیه خارن."

قوتابییێت وێ هەردەم دبێژنێ " خانم .. ئەگەر چاڤێت تە دەبانجه بان، ئەم هەمی دا دمری بین."

# ڤێرا لازاراتو
# بەرازیل

**" ئەز یا ڕژد بوم دیار کەم کو هەژارا شیانا ئەکادیمی هەیە"**



دەمێ ئەردێ وان دەست ب سەردا هاتیە گرتن دا بێتە ب کار ئینان بو ڤەکرنا جادەکا نوی، ئـا کنجیێـت رەخ و ریێـت بـاژێرکێ ( سـلڤادور دی باهیا ) بێ بچویك، بەرەف زەلکاوێت مـانگروف چون ل ( نوڤوس ئالاگادوس ) کو دکەڤیتـە سـەر توخیبێ کەنداڤێ ( کابریتو ).

ئەڤ خەلکێ کو بەرێ جوتیـار و ماسـی گـر و خودانێت پارچێت عـەردێت بچـویك، ئـەڤێت ژ نـوی هاتینـە دەرئێخسـتن، بونـە کارکـەرێن نەفەرمی. دماوێ ٢٠ سالا دا ژمارا خەلکێ ڤی باژێرێ ژ کولکا هاتیە ئاڤاکرن ژ ٧٥٠ کەسا بو ١٢ هزار. نەبونا خانیا و عەردی و بێ کـاریێ و نەخوێنـدەواریێ و کویلەی یا کو بەری نزیکی چەرخەکی نەمای، ئەڤ تشتە هەمی ل ڤێرە ب شێوەکێ بەرفرە دئێتە دیتن. زور بەیا وان دکولکێت گەلەك خراب ڤە دژین ل سەر عەردەکێ وان بو خو چاك کریە ڤە. هندەکێت دی ژی د هندە خانیـا ڤـە دژیـن کـو ل سـەر ستوینکا دراوستاینە. لێ د سەر ڤان هەمی کاودانێت نەخوش را، ڤستەڤال دئێنـە گێران ل بەر لێڤا ئاڤێ و ل بەر دەنگێ دەهولا و لەیزینێ.

ڤێرا لازاراتو ل سالا ١٩٧٧ یاهاتیە ( سالڤا دو دی باهیا ). ژبـەر نەخوشـی و کاودانێت خرابێت ڤی خەلکێ هەژار، ڤێرایێ دەست پـێ کـر هاریکاریـا وان کـر ئەوژی ب پەیداکرنا ژینگەهەکا فێرکرنێ ل دویف هەوجەیێت وان. ڤێرا دبێـژیت"

ئەز یا رژد بوم ل سەر هندێ کو وێ هزرێ ب نەوەیی دەربێخم یـا دبێـژیت هـەژارا شیانا ئەکادیمی نینە". ئینا قوتابخانەکا بچویك ل ڤی باژێرکی ڤەکر و ئەوێن ژیـێ وان ١٤-١٥ سالی فێرکرن دا هاریکاریا وێ بکەن و گازی دەیکا بکەن.

ڤێرا، کو داخبارا پەروەکارێ بەرازیلی(پولو فریری ) یە، رێکێت وی د زانسـتێ فێرکرنێ دا و بەرمابێت بەرنیاس بو زاروکا ب کارئینان. ئـەوێ پـەیڤێت وان بخـو دفێرکرنێ دا ب کارئینـان: ئارایـا ( فروکـەکا کاغـەزی یـا بچـویك). قارەمانیـا فروکێت کاغەزی هەروەسا دەلیڤە بو وان ڤەکر کو فێـری دەربرینـا پیتـا ( ر ) یـا زمانێ پورتوگالی ببن کو ژ دویماهیا گەوریێ دەردکەڤیت.

ڤێرا دبێژیت " دەمێ زاروك دگەهنە ژیێ ٧ تا ٩ سالیێ، هەست دکەن کو ئەو د بێ قیمەتن و وان چ پاشەروژ نینە. ئەزمانەکێ خراب، ب کـاردئینن. ل دورێـت پولێ دکەنە غار، رێزێ ل کەسێ ناگرن. دەمێ ڤێـرێ بجهـ دهـێلن کـو ژیـێ وان دبیتە ١٢ ، ١٣ سال، ئەوێت هاتینە گوهورین". ل قوتابخانا مللی یـا ( نوڤـوس ئەلگادوس ) سێ جورە یەکە هەنە: باغچەکێ ساڤایا، بنگەهەکێ فێرکرنا پیشـەی و بنگەهێ چاککرنا زاروکێت کولانا.

هزار زاروك دئێنـە ڤـێ کومەلگـەهێ. ڤێـرا پێڤـە دچـیت و دبێـژیت " بـرس ئارێشەکا ب ترسە ل ڤێرە. جارەکێ دپولەکێ ڤە من زارویەك دیت هەریێ سـەرێ خو ل ناڤبرێ داری ددەت، هەروەسا هەڤالێت خو د قوتان. پشتی هینگـێ بـومن دیار بو کو ئەو دو روژ بو وی خارن نە خاری. دوژمنکاری یا بەلاڤـە ل ڤـیرێ. لێ هەردەم ئەگەرێن خو هەنە ". د هندەك حالەتێت توند دا وەکی ڤێرا شروڤە دکەت " دەیك ب شەڤێ دەرمانا ددەنە زاروکێن خو بێت برسی دا بنڤن".

هەمی تشت ژ قوتابخانێ دکێمن و بان دلوپا دکەت. ڤێرا دبێژیت " ئەم خـارنێ ل قوتابخانێ ددەینە زراوکا کو بارا پتر فاسـولینە و ئـەوژی حکمـەت دکریـت. لێ سەلاجا مە شول ناکەت ژبەر هندێ ئەڤ خارنـە پـویچ دبیـت". فێرکرنـا ڤێرایـێ بەرهەمێ خو هەبو. " ل پێشییێ دەیباب د دو دل بون ل دور هنارتنا عـەیالێ خـو بو قوتابخانێت مە و نزیکی هەر ٣ قوتابیا، ئێکی قوتابخانە هـێلا. لێ پشـتی مـە

ئەنجامێت باش نیشادابن، ئەوێن قوتابخانە هێلاین، زڤری نە ڤە. ئێك ژ قوتابیێت مە نوکە یێ ل زانکوییێ دخوینیت کو جهێ سەر بلندییێ یە".

ڤێرا بەردەوامییێ ددەتە ئاخفتنا خو و دبێژیت " دێ یا ب زەحمەت بیت بەردەوامییێ ب دەیە ڤی کاری. ئەز هەردەم یا ل دراڤی د گەرم بو خارنێ و کەل و پەل و موچا. دەمێ من هەمی دچیت ب چونا من ڤە بو وەزارەتا و شارەوانیا و کومبونێن فەرمی.ئەڤە کارەکێ ٢٤ سەعەتییە، لێ ئەز حەژ زارویا دکەم. مێرێ من، کو ئەو ژی ل کومەلگەهێ کار دکەت، گەلەك هاریکاریا من دکەت و وورێن من بلند دکەت. ئەم تیمەکین. بو مە فێربون رزگار بونە."

# ئێمیلی جین نوئێل
## هاییتی

**" بتنێ نەوێن شیانێن فێرکرنێ هەین دڤیا پێ رابن"**
**"بوندی یایا بوندی یایا،کێلی واپ ڤینی پاو ڤینن چیرچێ ناو ... "**



ئـەی خـودێ مەزن،ئـەی خودێ مەزن،کـەنگی دێ ئێـی مە بەیە مال..."

قوتابییـــت قوتابخانـــا ( بیـــوروك ) یـــا ســـەرەتایی ل هاییتی ڤـان پـەیڤان ب سـرود دبێـژن و ئێـك ژ قوتـابی یـا گیتـــارێ لێ ددەت کـــو ژتەنەکـەکا روینـی یـا خـالی هاتیە چێکرن. رێڤەبەرا وان ( ئێمیلی جین نوئێل ) ئێکە ژ وان رێڤەبـەرێن ژن یـێن کێم ل وەلاتی.

هاییتی، کو تاکە دەولەتە هەتا نوکە هاتیە دامەزراندن ژ لایـێ کویلێـت رەش ڤە، ب دەهان سالا نەخوشی ل سـەر دەسـتێ دکتاتوریـەتێ دیتیـە. ئـەڤرو ٧٠ ژ سەدێ ژخەلکێ هاییتی دبن هێلا هەژرایەکا گران دایە کو خارن و ئاڤ و قوتابخانە و خانییێت باش دکێمن. رەخ و رێێت ( بیوروك ) دهشـك و پـر بـەرن و عـەردەکێ کێم بەرهەم هێنەرە. لێ د سەر هنـدێ را هنـدەك ئاکنجێـت شـیاین بـەردەوامیێ بدەنە ژیانێ ل ڤێرێ. هەر ژ مێژە هەژاریێ زەلام نەچارکرینە کو ل شولی بگەرن ل جێهت دی وەکی دروینا سلکێت شـەکرێ ل( سـان دومینکـو ) یـان کـارکرن وەك

پالێت بارکرن و دانانا کەشتیا ل (کاپ هـایيتی ). ژن نیڤـا مـالێ ل ( بیـوروك ) برێڤە دبەن.

ژ بو سست کرنا ئێش و ئازارێت برسـێ کـو رێکـێ ل فێربـونێ دگریـت، ژ بـو پالدانا دەیبابا کو زاروکا فرێ کەنە قوتابخانێ، خارن دئێتە دان ژ لایێ رێکخـراوا خارنا جیهانی ڤە. دڤێت قوتابیێـت ئێمیلیـێ هـەمی روژا دارا دگـەل خـو بینـە قوتابخانێ داکو بکار بینن وەك سوتەمەنی و خو ل بەر گەرم کەن. دگەل هنـدێ ژی ئێمیلی دبێژیت" دار گەلەك یێ کێم دبیت کو قوتابی نەشێن هـەمی روژا بیـنن. برینا دارا ل هاییتی ئاریشەکا مەزنە.

ئێمیلی دبێژیت" ئەم گەلەك دڤەدەرین و مە ئارێشێن مەزن یێت هەین. هـەما لێ نێرینا وان روژ هەمی پێ دچیت.

پەیداکرنا تەباشیرێ و کورسیکا و کەل و پەلێن دی تشـتەکێ ب زەحمەتـە.ئـەز وەختێ خو خرێ دبەم ب هەولدانا دیتنا چارەسەریا بو سەدەها ئارێشا ". ئێمیلـی خەلکێ ل دورێت خو پالدەت کو بو خو مفای ژ سەرچاوێن هـەین وەرگـرن. هـەول دانێت وێ بەرهەم پێڤە دئێت. کو ئەڤەژی باشتر لێ هاتنا قوتابخانێ یا بەردەوام یا دیارە.

ئێك ژ سەرکەفتێن ئێمیلی ئەو بو کو ئەو شیا ژنکا رازی کەت کو پشـکدارێ دفێرکرنا زراوکێت خو دا بکەن ئەوژی ب مەزاختنا داهاتیێن وان ژ فروتنا کارێت دروارێ و کارێت دەستی.

نە ئارامیا رامیاری ل ڤێ دویماهیێ دیار کـر کـو ئەڤـە ١٠ سـالە مـەزاختن ل فێرکرنێ نەهاتیە کرن. ناڤ نڤێسینا زاروکا بو قوتابخانێ بتنێ ٤٤ ژ سەدێ یـە و پیچەك ژ نیڤا وان یێت د چنە قوتابخانا سەرەتایی، خانـدنێ ب دویمـاهی دئینـن. کێمتر ژ ئێك ژ سێ ژ ڤان قوتابیا دگەهنە قوتابخانا نـاڤنجی. ل دەڤـەرێن دویرنـە تشتەکێ کێمە کو کەسێت ژیـێ وان ١٧ یـان ١٨ سـالی قوتـابی بـن ل قوتابخانـا سەرەتایی.

ل ( بیوروك ) ٤ ماموستایێت هەین بو ٢٦٠ قوتابیا کو ئەڤەژی گەلەك کـێمن ب هزرا ئێمیلیێ " گەلەك کێمە و دویرە بو ئێکی ل نەوعیەتێ بگەریێت ". هـەر

چەندە پەروردە و فێرکرن یا پەروەیە، لێ کوملگەهـ پشکداریێ دکەت د دابین کرنا پەرتوکا و موچێت ماموستا دا.

ئێمیلی بەردەوام کار دکەت ژبو خوشکرنا ژینگەها قوتابییێت خو. ل بن چاڤدێریا وێ نوکە هوستایەك یێ کو گایەکێ ئاڤا دکەت بو ئەو خارنا دئێتە دان ژ لایێ رێکخراوا خارنا جیهانی ڤە. هەروەسا دەست ئاڤەك ژی یا دئێتە ئاڤاکرن کو ئەڤەژی دەلیڤەیە بو ئێمیلیێ کو قوتابیا فێری تەندروستیێ بکەت.

موچێ ئیمیلیێ نەبەس یێ کێمە بەلکو هەمی وەختا ل دەمەکی دیارکری ژی وەرناگریت. هاتن و چون بو وێ سەرئێشیەکا ب درستی یە. ئێمیلیی دبێژیت "هاتنا قوتابخانێ ئارێشەیە کە " ئێمیلی ٥ کیلو مەترا دویر ژ قوتابخانێ دژیت و ب ترومبێلەکا کەسایەتی دئێت و دچیت کو ئەڤەژی ل سەر وێ ب پارەکێ گران د راوستیت، کو دبیتە پتر ژ وی یێ ئەو وەردگریت. ئێمیلی بەردەوامیێ ددەتە ئاخفتنا خو و دبێژیت" دڤێت ئەز دەمژمێر ٦ ژمال دەرکەڤم دا بو دەمژمێر ٨ ل قوتابخانێ بم". پێڤەدچیت و دبێژیت" دڤێت بریارا کو تو ماموستایێ دەڤەرەکا دویر بی ب سڤکی نەئێتە سەحکرن. دگەل هەمی قوربانی و مەترسییێت پێدڤی، بتنێ دڤێت ئەو کەس ب کارێ فێرکرنێ رابن ئەوێن شیان هەین" د سەر ڤێ چەندێ را، ئێمیلی حەژ کارێ خو دکەت" هەمی گاڤا ئەز دگەل زراوکا هەست دکەم کو ئەز یا ل مال، و ژبەر کو دەیباب تێ دگەهن و د نزیکن ژ من کا ئەز چ دکەم ژبەر هندێ ئەزب هەمی شیانێن خوهەول ددەم ".

# سوپاسی

یونسکو و پەروەردا جیهانی سوپاسیا خو دەردبرن بـو وان کەسـا یێـت ب گەرمی و ب چالاکی هاریکاری کری د دەرئێخستنا ڤێ نامیلکێ دا. هندەك ژ وان یێ ل نڤێسینگەها سەرەکی و هندەك ل فیلدی و یێـت دی کـو روژنامــە ڤـانن و ناڤێت وان بومە نە ددیارن. سوپاسیەکا تایبەت بو رێکخـراوا خارنـا جیهـانی بـو دیارکرنا ماموستایا ل هاییتی و نایجیر و ب ستویێ خو ڤەگرتنا خەرج کرنا هاتن و چونێ بو روژنامە ڤانا. بییێ هایکارییـا ڤـان هـەمی بەشـدارا، ئـەڤ نامیلکـە نـە دەردکەت.

**پروگرامێ جیهانی پەروەردە بو هەمیا**
**یونسکو**
**پاریس**

**پەروەردا جیهانی**
**بروکسل**
**بەلجیکا**

**From:**"Murtagh, Teresa" <t.murtagh@unesco.org> Add to Address Book**To:**"Hakim Abdullah" hakimabdullah٦٩@yahoo.com
**CC:** educint@infoboard.de**Subject:** RE: Publishing Broucher**Date:**Mon, ٢٩ Mar ٢٠٠٤ ١٢:٥٣:٤٩ +٠٢٠٠Dear Mr Abdullah,

Congratulations on taking the initiative to publish *Portraits in Courage* into Kurdish.
Of course, we have no objection to your doing so and indeed are very happy about it.

For your information, two other brochures on teachers were produced in the same series.

*The Quiet Peacemakers* and *Class Acts*

*You will find them on the Internet at:*

Teresa Murtagh

-----Original Message-----
**From:** Hakim Abdullah [mailto:hakimabdullah٦٩@yahoo.com]
**Sent:** Sunday, March ٢٨, ٢٠٠٤ ٦:٢١ PM
**To:** t.murtagh@unesco.org
**Cc:** educint@infoboard.de
**Subject:** Publishing Broucher

Dear Sir / Madam

" Portraits in Courage " is a broucher published in English by UNESCO
and Education International. It is about ten teachers from

different
parts
.of the world who continue their work as teachers in difficult

conditions. I
found it very useful and interesting to be read by the teachers
and
students
in our area. Therefore, I have translated it into Kurdish
Language and
ready
to be published. In this regard, I would be pleased and very
grateful
to
ask your agreement and seek your advice and comments that
will enrich
this
very useful work.

This is to inform you that I worked for UNESCO as an
Education
Assistant under Oil-for-Food Programme in Iraq, Dohuk Office
from June
٢٠٠١
to December ٣١, ٢٠٠٣.

Your guidance is highly appreciated.

Best Regards

Hakim Abdullah
Dohuk, Iraq

**From**: "Murtagh, Teresa" <t.murtagh@unesco.org >
**To**: "Hakim Abdullah" <hakimabdullah٦٩@yahoo.com >
**CC**: educint@infoboard.de
**Subject**: RE: Publishing Brochure
**Date**: Mon, ٢٩ Mar ٢٠٠٤ ١٢:٥٣:٤٩ +٠٢٠٠

Dear Mr Abdullah،

Congratulations on taking the initiative to publish Portraits in Courage into Kurdish.
Of course, we have no objection to your doing so and indeed are very happy about it.

Kindest regards،

Teresa Murtagh

## وەرگێر د چەند ڕێزەکا دا

سالا ١٩٦٩ ل دهوکێ ژ دایك بویە.

سالا ١٩٩٠ پشکا زمانێ ئنگلیزی ـ کولیجا پەروەردێ ـ زانکویا مویسل ب دویماهی ئینایە.

کار کریە وەك ماموستایێ زمامێ ئنگلیزی د قوتابخانێت نافنجی و دواناڤنجی دا ل دهوکێ.

د بوارێ پەروەردێ دا ل ڕێکخراوا یونسکو کارکریە.

هەر ژ نیڤا سالێت هەشتێیا دەست دایە نڤێسین و بەلاڤ کرنا کورتە چیروکێ.

بابەتێت جوراو جور ژ زمانێ ئنگلیزی وەرگێراینە سەر زمانێ کوردی و ئەرەبی.

چەندین بابەت د گوڤار و روژنامێت کوردی دا بەلاڤ کرینە.

ئەندامێ دەستەکا نڤێسینا گوڤارا ( نوخازی ) بو ل سالا ١٩٩١.

ئەندامێ ئێکەتیا نڤێسەرێت کوردە ـ تایێ دهوکێ.

وێنێن نەترسیێ ئـێش و ئـازار و سـەربۆر و کـاودانێن شولی یێن دەه مامۆستا ژ پارچێن جۆدا جۆدایێن جیهانێ بۆمە ڤەدگێڕیت، ئەوێن شیاین دسـەر هەژاریـەکا گـران و هەڤرکییا چەکداری و نەبوونا کـەل و پـەلێن فێرکرنـێ را، زارۆکان فێرکەن. پەسنا ژیانا وان یا ڕۆژانە، یاکو هەسـتێ مرۆڤی دلڤینیت، ڤان مامۆستا نێزیکی مە دکەت.

ئەڤ نامیلکەیە ڕێزگرتنـە بـۆ وەفـاداری و سـۆزداری و دلسۆزی یا وان ل سەر گازی یا ئەرکی.